حکومەتی هەرێمی کوردستان- عێراق
وزارەتی پەروەردە
بەرێوەبەری گشتی پرۆگرام و چاپەمەنیەکان

# پەروەردەی مەدەنی

## فێربوون دەربارەی بەرپرسیارەتی

بۆ

## پۆلی سێیەمی بنەڕەتی

ئامادەکردنی
لێژنەیەك لە وەزارەتی پەروەردە

پێداچوونەوەی زانستی
یوسف عوسمان حەمەد

چاپی پێنجەم
٢٠١٦ زاینی- ٢٧١٦ کوردی- ١٤٣٧ کۆچی

سەرپەرشتی زانستی چاپ: یوسف عوسمان حەمەد

سەرپەرشتی هونەری چاپ: عوسمان پیرداود ـ خالد سلیم محمود

دیزاین و نیگارەکان: نەجمەددین بیری

ئامادەکردنی چیرۆکەکان: دلێر ئیبراهیم

تایپ و جێبەجێکردنی بژاری هونەری: شیماء یاسین

# ناوەڕۆك

# پێشەکی

مامۆستای دڵسۆز، پەرتووکەکانی پەروەردەی مەدەنی هەنگاوێکی پەروەردەییە لە قوتابخانە بنەڕەتیەکاندا، کە لە چوارچێوەی رەوشت و گۆڕانی رەفتاری دەبێت بەرەو ئەوەی کە منداڵ چۆن کەسایەتی خۆی دروست بکات و متمانەی بە خودی خۆی بکات و کەسێکی کارا و بوێربێت لە ناو کۆمەڵگەدا. پەرتووکەکانی پەروەردەی مەدەنی بە هەر چوار بابەتی (بەرپرسیاریەتی و تایبەتمەندی و دادوەری و دەسەڵات) بابەتی رەفتاری هزرین، واتە یاری کەسایەتی و بوێرییە، ئەم بابەتانە بۆ خوێندنی دێربەدێر و ڕێنووس کردن نییە، بەڵکو چالاکی گرووپی نێوان خودی خوێندکاران – قوتابیان و مامۆستایە بۆ زاخاوی مێشک و چالاککردنی هزری منداڵە، کە چۆن پەیوەندی بەهێز دەبێت لەگەڵ ژینگەدا.

مامۆستای بەڕێز مەرج نییە بە تەواوەتی پابەند بێت بە دەقەکانی ناو پەرتووکەکە، ئەمە تەنها جۆرە شێوازێکە بۆ زانینی چۆنیەتی وانەوتنەوە و راهێنان و مەشقی هزری واتە دەبێت مامۆستا بیرکردنەوەی لە سنووری ئەم پەرتووکانە فراوەنتر بێت بۆ چالاکی، نموونەی ئەمانە بهێنەوە، لە ژینگەی منداڵ و ئەو ئاژەڵانە باس بکە کە لەلای منداڵ خۆشەویستن، لە ژیانی رۆژانە و ژینگەی دەوروبەری نموونە بهێنەوە، کاتێ باسی دادوەریی دەکەیت مەرج نیە باسی چیرۆکی کتێب بکەین باسی دادوەری رۆژانە بکە کە خودی قوتابی – خوێندکار پێی خۆشە و چێژی لێ وەردەگرێت.

پەرتووکی پەروەردەیی مەدەنی دەبێت لە بەر دەستی قوتابی – خوێندکار بێت بۆ ئەوەی لەماڵەوە لەگەڵ خێزانەکەی باسی بەرپرسیاریەتی و دەسەڵات و دادوەری و تایبەتمەندی بکات.

مامۆستایی بەڕێز.. هەوڵبدە منداڵ فێری ئەوە بێت خۆی نموونەی رۆژانە بهێنێتەوە بە بەشداری مامۆستا مەبەست میتۆدی باسەکەیە، بۆ نموونە لەسەر تایبەتمەندی قسە دەکەیت با لە ماڵێ خۆی دەست پێبکات، نەک لە دەقەکانی ناو پەرتووکەکە. ئەم پەرتووکانە تەنها بۆ رینیشاندەر و ئاسانکاری مامۆستایە کە لەم شێوازە چالاکی بکات لە ژینگەی خۆیدا، بە هاوبەشی نێوان قوتابی و مامۆستا، لە تاقیکردنەوەدا دەکرێت باس لە چالاکی رۆژانە و نموونەی مامۆستا و قوتابی ببێتە هەوێنی پرسیارەکان لە رۆژانە و مانگانەدا.

**لیژنەی پەروەردەی مەدەنی**
**وەزارەتی پەروەردە**

# بەرپرسیاریەتی

- پێناسەکەی/ جێبەجێکردنی ئەرکی ڕۆژانەیە.
- مامۆستا/ پێویستە قوتابی فێر بکرێت چۆن بیربکاتەوە و داهێنان دروست بکات.
- مامۆستا/ باس لە کێشەیەک بکات کە ڕۆژانە قوتابیان لە ناو کێشەکەدا ژیان دەبەنە سەر و، پەیوەندی بە بابەتەکەوە هەبێت تا قوتابییەکان لە ناو خۆیاندا گفتوگۆی لەسەر بکەن و چارەسەری گونجاوی بۆ بدۆزنەوە.
- قوتابیان فێربکرێن (چەمکی) بەرپرسیاریەتی چی یە؟
- فێری ڕاهێنان بکرێن لەسەر بیروبۆچوونی جیاواز لەسەر چارەسەرکردنی کێشەکانی ناو پۆل (پاکوخاوێنی).
- فێری بەرپرسیاریەتی کەسی و گشتی بکرێن.
- مامۆستا/ پێویستە مەشق و ڕاهێنانیان پێبکات لە نێو پۆلدا بەرامبەر بە (ماف و ئەرک).
- ئەو (دەستەواژانە) مامۆستا دەتوانێ هەمووی بەشێوەی گرووپ لەگەڵ قوتابییەکان باسی لێوە بکات بەشێوازی چیرۆک و یان بەشێوەی شانۆگەریی لە نێو پۆلدا، تا لە ڕێگەی ئەو چیرۆک و درامایانە بۆیان ڕوون بێتەوە.
- بەپرسیاریەتی کەسی چییە؟ بەرپرسیاریەتی بەرامبەر خۆت.
- بەرپرسیاریەتی گشتی چییە؟ بەرپرسیاریەتی بەرامبەر دەورووبەر (ژینگە).



## لەم وێنەدا فێر دەبین:-

١. رێکخستنی کەلوپەلی تایبەتی ئەرکی تاکە.
٢. یارمەتیدانی دایک و باوک بەرپرسیاریەتیە بۆ هەمووان.
٣. خاوێن راگرتنی کەلوپەلەکەمان بەرپرسیاریەتیە.



* لە روانگەی هەستکردن بە بەرپرسیاریەتی گۆرەپانی قوتابخانە خاوێن دەکەینەوە؟ بۆچی؟
* کارزان کاغەزی فڕێ دایە باخچەی قوتابخانە؟ لەسەر ئەمە بدوێ؟

# هاوڕێی باش هەڵدەبژێرم



**لەم وێنەدا فێر دەبم :-**

* بەشێوازێکی جوان لەگەڵ هاوڕێیەکانم رەفتار دەکەم.
* رێز لە بۆچوونی هاوڕێم دەگرم.
* بە هێمنی و بێ دەنگی یاری دەکەم.
* هەوڵ دەدەم کاتێکی خۆش لەگەڵ هاوڕێکانم بەسەرببەم.

## بەرپرسیاریەتی چییە؟

## تۆ لەم وانەیەدا چی فێردەبیت؟

هەرکەسێک لەئێمە چەند کارێکی هەیە دەبێت بیکات. ئێمە بەم کارانە دەڵێین بەرپرسیارێتی. لەم وانەیەدا تۆ فێردەبیت چۆن بەرپرسیار دەبیت. تۆ فێردەبیت بۆچی گرنگە ئەم بەرپرسیارێتیانە جێبەجێ بکرێت.

## چەند وشەیەک بۆ فێربوون

**بیروباوەڕ**

**بەرپرسیارێتی**

**ئەرك و ماف**

# بەرپرسیاریەتی چییە؟

ئازادو تارا بە دایکیان گووت: (دەتوانین جوجەڵەیەک بەخێوبکەین بەڵێنیش دەدەین هەموو ڕۆژێک جێگاکەشی پاک بکەینەوە.)

دایکیان گووتی باشە، بۆتان دەکڕم.

ئازادو تارا بەڵێنی چییان دا؟



**چی ڕودەدات ئەگەر بەڵێنەکەیان بەجێ هێنا؟**

**چی ڕودەدات ئەگەر بەڵێنەکەیان بەجێ نەهێنا؟**

**هەرکەسێك لەئێمە چەند کارێکی هەیە دەبێت بیکات.**

بۆ نموونە مامۆستاکەت یارمەتیت دەدات بۆ ئەوەی فێر بیت، دایک و باوکت ئاگایان لە تۆیە.

کەواتە هەر بەرپرسیارێتییەک ئەرکێکە ئەویش پێویستە لەسەر تۆ کە بیکەیت.

- دەبێت ئەو شتانەی کە یاری پێدەکەیت کۆیانبکەیتەوە.
- دەبێت ئەرکی ماڵەوە جێبەجێ بکەیت.

هەروەها بەرپرسیارێتی ئەوە دەگەیێنێت کە دەبێت بەشێوەیەکی دیاریکراو بەجێبهێنرێت.

- ئێمە دەبێت ڕێز لە هەستی کەسانی تر بگرین.
- ئێمە دەبێت ڕاستی بڵێین.

کاتێ تۆ بەرپرسیارێتی بەجێ دەهێنیت شتی باش ڕوودەدات. کاتێک کە تۆئەرکی ماڵەوە دەکەیت، شتێک فێردەبیت و هەست بەشانازی دەکەیت.

ئەگەر تۆ بەرپرسیارێتییەکت بەجێ نەهێنا چەند شتێکی تر ڕوودەدات، ئەگەر ئەرکی ماڵەوەت بەجێ نەهێنا تۆ شتی زیاتر فێرنابیت، تۆ شانازی بەخۆت ناکەیت.

تۆچۆن بەرپرسیاردەبیت؟

چەند ڕێگایەکە کە ئێمە بەرپرسیار دەبین.

ئێمە بەڵێن دەدەین کە شتێک بکەین، بەڵێنەکەی خۆمان دەبێتە بەرپرسیارێتی.

# ئەركی بەرپرسیاریەتی قوتابی بەرامبەر ئەركی ڕۆژانەی قوتابخانە و پاك و خاوێنی

ماردین و مەتین خوشک و بران نیشتەجێی شاری سلێمانین هەردووکیان قوتابی پۆلی سێیەمی بنەڕەتین. ماردین کچۆلەیەکی جوان و پاک و ژیرە زۆر حەز بەپاک و خاوێنی دەکات، هەمیشە بایەخ بە پاک ڕاگرتنی پۆشاک و خاوینی کەلّ و پەلەکانی دەدات، بەلاّم مەتینی برای کەمتەرخەمە وەکو ماردینی خوشکی زۆر گرنگی بەپاک و خاوێنی نادات، ماردین جگە لە پاک و خاوێنی خۆی، ڕۆژانە تاکو ئەرکی ڕۆژانەی قوتابخانەی جێبەجێ نەکات ناخەوێ و خەوی لێ ناکەوێ بەلاّم مەتین وەکو ماردین هێندە ڕشت نیە لەسەر ئەنجامدانی ئەرکی ڕۆژانەی قوتابخانە و پاک و خاوێنی خۆی، بۆیە ماردین هەموو کاتێک ناکۆکە لەگەلّ مەتین لەسەر کەمتەرخەمیەکەی لە جێبەجێ نەکردنی ئەرکی ڕۆژانەی و خاوێنی ڕانەگرتنی چونکە ماردین هەست





دەکات ئەگەر`هاتو قوتابی لە قوتابخانە بایەخ بە پاک و خاوێنی خۆی نەدات قوتابیانی پۆلەکەیان حەزیان لێ ناکەن و هاورێیەتیان لەگەڵدا ناکەن، لە هەمان کاتدا دەبنە مایەی شەرمەزاری قوتابیانی پۆلەکەیان و سەرکۆنە کردنیان لەلایەن مامۆستاکانەوە.

## - چالاکی

مامۆستا/دەتوانێ لەم چیرۆکەدا چالاکی لە نێو پۆلدا ئەنجام بدات.

مامۆستا لە ئەنجامی گفتوگۆکردن لەسەر ئەم دوو وێنەیەدا پێناسەیەکی بۆ چەمکی بەرپرسیاریەتی لەلا بەرجەستە دەبێت.

ئەویش به پێناسەکردنی بە شێوەی (تیوری و کرداری).

کەواتە پێناسەیەکی دروست بۆ چەمکی بەرپرسیاریەتی دێتە کایەوە بەم شێوەیە:-

(بەرپرسیاریەتی جێبەجێکردنی ئەرکی رۆژانەیە)

لە ئەنجامدا قوتابیان بۆیان روون دەبێتەوە هەموو تاکێک لە کۆمەڵگەدا رۆژانە بەرپرسیارە لە جێبەجێکردنی ئەرکی رۆژانەی و پاک راگرتنی خۆی و کەلوپەلەکانی.

**بۆ نموونە:** قوتابی بەرپرسیارە لە جێبەجێکردنی ئەرکی رۆژانەی.

مامۆستا: بەرپرسیارە لە جێبەجێکردنی ئەرکی رۆژانەی.

هەموو کارمەندێکی حکومەت بەرپرسیارە لە ئەنجامدانی ئەرکی رۆژانەی.

نموونەی تر قوتابیان بابزانن چۆن ئەوان بەرپرسیارن لە جێبەجێکردنی ئەرکی رۆژانەیان ئاواش سەرۆکی خێزان و تاکو بگرە سەرۆکی حکومەت بەرپرسیارە لە جێبەجێکردنی ئەرکی رۆژانەی.

(مامۆستا دەتوانێ گفتوگۆ لەسەر ماف و ئەرکدا بکات).

بە نووسینی دەستەواژەی (هەموو مافێک ئەرکی بەرپرسیاریەتی لە ئەستۆیە) لەسەر تەختە وەکو چالاکی گفتوگۆی لە سەر بکات لەگەڵ قوتابییەکان، تاکو بۆیان روون بێتەوە هەر تاکێک لە نێو کۆمەڵگەدا رۆژانە بەرپرسیارە لە راپەراندنی ئەرکی رۆژانەی، تا قوتابی ماف و ئەرکەکانی بناسێ.

تا قوتابی بزانێ هەندێک بەرپرسیاریەتی دەکەوێتە ئەستۆی، وەکو بەرپرسیاریەتی بەرامبەر (دایک و باوک – قوتابخانە و ژینگە).

ئینجا مامۆستا دەتوانێ بەشێوەی چالاکی لە نێو پۆلدا لەگەڵ قوتابییەکاندا گفتوگۆ لەسەر چەند بەرپرسیاریەتییەک بکات کە رۆژانە قوتابیان دەتوانن ئەنجامی بدەن.

**بۆ نموونە/** بەشداری کردن لە پۆل بۆ پاک و خاوێنی.

- هاوکاری کردنی باوکی.
- یارمەتیدانی دایکی ئەگەر داوای یارمەتی لێکرد.
- یاریکردن لەگەڵ تیمی گەرەکەکەیان کە زۆر حەز لە وەرزش دەکات.

-ئەمانە هەموو بەرپرسیارتییە ئەگەر ئەنجامیدا ئەوا سوودی پێ دەبەخشێ، ئەگەر لە دەستیشدا ئەوا بەهاکانی لە دەست دەدا.

## چەند کێشەیەک بۆ چارەسەر کردن

ئەو بەرپرسیارێتیانە بخوێنەوە کە کەسانی ترهەیانە. پاشان وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە کە لە خوارەوە ئاماژەیان پێکراوە :

ئازاد پێش ئەوەی لە شەقام بپەڕیتەوە سەیری ئەم لاوئەولای خۆی دەکات.

سارا ئۆتۆمبێلەکەی دەوەستێنێت، کاتێک گڵۆپی سووری ترافیکەکە پێ دەبێت.

سامان پێش تەماشاکردنی تەلەفزیۆن ئەرکی ماڵەوە جێبەجێ دەکات.



شیرین دەبێت هەشتی بەیانی لەسەر کاربێت.

ئالان ئەندامی یانەی تۆپی پێیە، هەموو رۆژێک دەبێت دوای تەواوبوونی ئەرکەکانی قوتابخانە بچێت بۆ راهێنان.

دیارگوتی دوای تەواو بوونی قوتابخانە دەچم ئالان دەبینم.

**کێ بەرپرسیارە؟**

**بەرپرسیارێتییەکە چییە؟**

**چۆن کەسێک بەرپرسیار دەبێت؟**

**چی ڕوودەدات کاتێک هەریەکێک لە ئێمە ئەو ئەرکە بەجێ دێنێت کە دەبێت بیکات؟**

**چی ڕوودەدات کاتێک ئەو ئەرکە جێبەجێ نەکات کە دەبێت بیکات؟**

## بابزانین تۆچی فێربوویت؟

وێنەی کوڕو کچێک بکێشە، لەوێنەکەدا ئەوە نیشان بدە کە ئەمانە ئەرکێکیان لەسەرە دەبێت بیکەن.(وەکو خوێندن بەیەکەوە) ئامادەبە چی لەبارەی وێنەکە دەزانیت بە پۆلەکەت بڵێیت، پێمان بڵێ چۆن ئەم کەسە بەرپرسیارە؟ چی ڕوودەدات کاتێک ئەم کەسە ئەرکی خۆی بەجێ دەهێنێت؟ چی ڕوودەدات کاتێک ئەم کەسە ئەرکی خۆی بەجێ نەهێنێت؟ پێمان بڵێ بۆچی گرنگە بەرپرسیاربین لە هەڵسوکەوتماندا.

## چالاکی

١ـ داوا لە بەڕێوەبەری قوتابخانەکەت بکە سەردانی پۆلەکەت بکات، داوای لێ بکە چەند شتێک لەسەر تەختەڕەشەکە بنووسێت کە پێویستە بیکات، پاشان چەند پرسیارێک بکە.

**چۆن بەڕێوەبەر ئەم بەرپرسیارێتیانەی وەرگرتووە؟**

**چی ڕوودەدات کاتێک بەڕێوەبەر ئەم بەرپرسیارێتیانەی جێبەجێ دەکات؟**

**چی ڕوودەدات کاتێک بەڕێوەبەر بەرپرسیارێتییەکانی بەجێ نەهێنێت؟**

**بۆچی ئەم بە رپرسیارێتیانە بۆ قوتابخانەکە گرنگە؟**

٢ـ لە قوتابخانەکەدا قسە لەگەڵ دوو قوتابی دیکە بکـە. داوایان لێ بکە کە دوو لەو شتانە بڵێن کە بەرپرسیارن لێی. ئامادەبە لەگەڵ پۆلەکەدائەم شتانە گفتوگۆبکە.

- **چۆن ئەم بەرپرسیارێتیانە فێربوون؟**
- **چی ڕوودەدات کاتێک بەرپرسیارێتیەکە بەجێ دەهێنن؟**
- **چی ڕوودەدات ئەگەر بەجێ نەهێنن؟**

٣ـ لە خەیاڵی خۆتدا هۆنراوەیەک یاخود چیرۆکێک دروست بکە. ئەگەر لەتواناتدا هەبوو بینووسە. تیایدا باس لەو ئەرکە بکە کە تۆ هەتەو پاشان ڕوونی بکەرەوە بۆچی بەلاتەوە گرنگە.

٤ـ لەسەر پارچە کاغەزێک وێنەی قوتابییەکی هاوڕێت بکێشە، لە وێنەکەدا پیشانی بدە کە ئەم هاوڕێیەت ئەرکێک بەجێ دەهێنێت. تۆ دەتوانیت وێنەیان بکێشیت لە کاتێکدا کە ددانیان دەشۆن، یاخود قژیان شانەدەکەن، وێنەکەت ڕەنگ بکە.

## چەند بیرۆکەیەك بۆ فێربوون

## سوودو بەهاکانی بەرپرسیارێتی چییە؟

ئەو سوودانەی کە لە بەرپرسیارێتی فێری دەبیت ئەمانەی لای خوارەوەن:

**ئێمە دەزانین ئەو شتانەی کە لە داهاتوودا چاوەڕوانی دەکەیت.**

کاتێک تۆ بەڵێنێک دەدەیت، ئێمە باوەڕ بەتۆ دەکەین ئەگەر تۆ ئەو بەڵێنەی کە ئەمڕۆ دات بەجێ بهێنیت ئێمە باوەڕ بە تۆ دەکەین کە پەیمانی بەیانیش بەجێی بهێنیت. بەمجۆرە متمانە بەتۆ دەکەین و خەڵک بڕوات پێ دەکەن.



**هەست بە ئارامی زیاتر دەکەیت**

ئەگەر گڵۆپی سەوز پێبوو پەڕیتەوە بۆ ئەوبەری شەقامەکە شوفێری ئوتومبێل متمانەت پێ دەکات. کاتێک گڵۆپی سوور پێ دەبێت شوفێرەکە رادەوەستێت، تۆش متمانە بە شوفێرەکە دەکەیت، بەمجۆرەش هەست بە ئارامییەکی زیاتر دەکەیت.

### دەتوانین کارەکان زووتر تەواو بکەین.

کاتێک هەر کوڕ و کچێک لە گرووپەکەدا کاری خۆی دەکات کارەکە بە بەشداری کردن زووتر تەواو دەبێت.



### پێویستە هەرکەسێك بەشی خۆی کار بکات.

کاتێک هەرکەسێک بەشی خۆی کاربکات بەمجۆرە یەک کەس هەموو کارەکان ناکات. واتە بە گرۆپ کار دەکەین.

### ئێمە شانازی بە گرووپەکەمانەوە دەکەین.

کاتێک هەر کەسێک لە گرووپەکە کاری خۆی کرد، شانازی دەکەین کە بەشێک بین لەم گرووپە.

### ئێمە هەست بەخۆشی دەکەین.

کاتێک ئەو کارانە ئەنجام دەدەیت کە لەسەرتە بیکەیت، خەڵک دەستخۆشیت لێ دەکەن.

**بەجێهێنانی هەر بەرپرسیارێتییەک چەند بەهایەکی هەیە، کە ئەمانەی لای خوارەوەن:**

**ئێمە دەبێت واز لە چەند شتێکی تر بهێنین.**

لەوانەیە کات و پارەی بوێت. لەوانەیە نەتوانیت ئەو شتانە بکەیت کە ئارەزووت لێیانە، وەک تەماشاکردنی تەلەفزیۆن یاخود کتێب خوێندنەوە.

**ئێمە لەوانەیە بترسین کە کارێکی خراپ دەکەین.**

تۆ لەوانەیە هەست بە نیگەرانی بکەیت کە ئایا خەڵک چۆن بیر لە تۆدەکەنەوە. تۆ لەوانەیە هەست بە دڵەڕاوکێ بکەیت و بیر لەوە بکەیتەوە کە چی ڕوودەدات، لە کاتێکدا ئەگەر سەرکەوتوونەبوویت.

**ئێمە لەوانەیە هەست بکەین زیاتر پێویستە لەگەڵ کەسانی دیکە کار بکەین**

تۆ لەوانەیە هەموو کارەکان بکەیت، لەوانەیە هەست بەوە بکەیت کە هەموو کارەکە بکەیت و کەسانی تر بەشە کارەکانی خۆیان نەکەن.





## ئێمە لەوانەیە هەست بە تووڕەبوون بکەین.

تۆ لەوانەیە پێویست بکات چەند شتێک بکەیت کە نەتدەویست بیانکەیت.

تۆ چۆن بڕیاردەدەیت کە ئایا بەرپرسیارێتی تازەت دەوێت؟ یەکەم، ئەوەیە کە تۆدەبێت سەیری سوودو بەهاکان بکەیت، تۆدەبێت بڕیاربدەیت کە ئایا سوودی زۆرترە یان زیان؟ دوای ئەوە بڕیاردەدەیت کەچی بکەیت.

## چەند کێشەیەك بۆ چارە سەرکردن.

لە خوارەوە چوار بەرپرسیارێتی دەخوێنینەوە وەڵامی پرسیارەکان بدەوە. سوودو بێ سوود( زیانەکان) دیاری بکە بەهۆی ئەو زانیارانەی کە فێری بوویت.

١ـ تاراو سامان بۆ یاریکردن دەچوونە دەرەوە. باوکیان گوتی:«تارا ئاگات لە برا بچکۆلەکەت بێت مەهێڵە ئازاری پێبگات.))

٢ـ منداڵەکان بۆ سەیران چوونە باخی گشتی. نیشانەیەک لە باخچەکەدا هەڵواسرابوو و نووسرابوو: تکایە پاک وخاوێنی باخچەکە بپارێزە.

٣ـ مامۆستا گوتی: ((تکایە هەموو پێنووسە ڕەنگاوڕەنگەکان دابەش بکەن.))

٤ـ زارا بەڵێنی دا کە کیک بۆ ئاهەنگی پۆلەکە دروست بکات.

# ئەرکی بەرپرسیاریەتی قوتابی بەرامبەر بە ماڵ و قوتابخانە

ئەلەند و سەهەند خوشک وبران نیشتەجێی شاری شەقڵاوەن. شەقڵاوە شارێکی دڵگیر و خۆشە، کەوتۆتە ژێر بناری چیای سەفینی سەرکەش، پڕە لە دارستانی گەورە و ئاوی سازگار و شارێکی فێنک و خۆشە، گەشتیاران لە هەموو شارەکانی دیکە لە هاویناندا رووی تێدەکەن بۆ ئەوەی چەند کاتێکی خۆشی تیادا ببەنە سەر.



ئەلەند و سەهەند قوتابی پۆلی سێیەمی بنەڕەتین، هەردووکیان لە پاش ئەنجامدانی ئەرکی رۆژانەی قوتابخانەیان یارمەتی ماڵەوەش دەدەن ئەگەر دایک و باوکیان داوای جێبەجێ کردنی ئەرکێکیان لێ بکەن، تاکو خۆشەویست بن لای دایک و باوکیان.



ئەلەند و سەهەند قوتابخانەش بە ماڵی دووەمی خۆیان دەزانن بۆیە ڕۆژانە شوێنی دانیشتن و ناو ژووری پۆلەکەیان وەکو ژووری ماڵەوەیان پاک ڕادەگرن هەرکاتێ پەڕەکاغەزێک یاخود پاشماوەی خواردەمەنییەک لە نێو ژووری پۆلەکەیان کەوتبێ یەکسەر هەڵی دەگرنەوە و دەیخەنە ناو سەبەتەی پۆلەکەیان تاکو پۆلەکەیان هەردەم بە پاک و خاوێنی بمێنێتەوە چونکە هەست دەکەن ئەوان بەرپرسیارن لە پاکڕاگرتنی ژینگەی قوتابخانەیان هەروەکو ژینگەی ماڵەوەیان.

**ـ مامۆستا/ دەتوانێ لەسەر ئەم چیرۆکە ئەم چالاکیانە ئەنجام بدات.**

١. دروستکردنی لیژنەی پاکوخاوێنی لە قوتابخانە کە پێکهاتبێ لەو قوتابیانەی کە ڕۆژانە ئەرکیان جێبەجێ دەکەن و پاک و خاوێنن.

٢. ئەنجامدانی چالاکی بەشێوەی شانۆگەری گوزارشت لە ژینگە پارێزی بکات لە ناو قوتابخانەدا، تا قوتابیان هەستی پاک راگرتنی ژینگەپارێزیان لا بەرجەستە بێت و ژینگەی قوتابخانەیان لا خۆشەویست بێت.

- ئینجا مامۆستا/ دەتوانێ (بەرپرسیاریەتی گشتییان) بۆ باس بکات کە هەموو تاکێک لە کۆمەڵگەدا بەرپرسیاریەتی هاوبەشی هەیە بۆ نموونە وەکو:-

- پاراستنی ژینگەی قوتابخانە و کەلوپەلەکانی.
- پاکڕاگرتنی باخچەی قوتابخانە.
- نەشکاندنی جامی پەنجەرەکان.

- مامۆستا ئەو دەستەواژانە لەسەر تەختە بە ماجیکی ڕەنگاوڕەنگ بۆیان بینوسێتەوە ئینجا لەگەڵ قوتابییەکان گفتوگۆیان لەسەربکات، یا بوار بە قوتابییەکان بدات هەرکەسە بەئازادانە گوزارشت لە بیر و بۆچونیەکانیان بکەن مامۆستا پێویستە ئازادیان بکات رەخنە بگرن تاکو ترس و شەرم لایان بڕەوێتەوە بواریان پێبدرێت نموونەی زیندوو بهێنێتەوە لەسەر بەرپرسیاریەتی کەسی و گشتی چونکە قوتابی شتی باشی لا هەیە ئەگەر ئازادی رادەربڕینی هەبێت لە نێو پۆلدا قسەبکات تاکو بۆیان روون بێتەوە بەرپرسیاریەتی کەس و گشتی تا چەند پەیوەندیان بەیەکەوە هەیە بۆ نموونە:-

- دکتۆر چارەسەری نەخۆش دەکات و بەرپرسیارە لە ئەنجامدانی ئەرکی

ڕۆژانەی لە نەخۆشخانە.

نموونەی دیکە بۆیان باس بکرێت:

- پۆلیسی هاتوچۆ ڕۆژانە ئەرکی بەرپرسیاریەتی ڕێکخستنی ناو شاری لە ئەستۆیە لە دروست نەبوونی جەنجاڵی و ژاوەژاوی ئۆتۆمۆبێل لە نێو بازار و شەقامەکاندا.

- (مامۆستا دەتوانێ گفتوگۆیان لەگەڵدا بکات وەکو چالاکی).

بۆئەوەی قوتابییەکان لە ناو پۆلدا زیاتر بەشداری بکەن پێویستە مامۆستا بوار بە قوتابییەکان بدات ئازادانە ڕەخنەبگرن و دەستنیشانی کەموکوڕیەکانی ناو پۆل و گۆڕەپانی قوتابخانە بکەن. بۆ نموونە:-

- لەسەر تەختە بنوسرێت کێ بەرپرسیارە لە پیسبوونی ژینگەی قوتابخانە؟

لەوانەیە قوتابیەک بڵێ بەڕێوەبەر بەرپرسیاری یەکەمە لە پیسبوونی ژینگەی قوتابخانە با ئازاد بکرێت لە ڕادەربڕین چونکە ئامانجی سەرەکی لە خوێندنی بابەتی پەروەردەی مەدەنی زیاتر بوار پێدانە بە قوتابی لە نێو پۆلدا ببێتە تەوەری سەرەکی گفتوگۆکردن تاکو خۆیان دەست نیشانی گرفت و کێشەکانی ناو پۆل بکەن و لەهەمان کاتدا چارەسەری گونجاوی بۆ بدۆزنەوە.

- دیاره ئەمەش بە شێوەی گرووپ دەبێت هەر گرووپێک لە نێوان خۆیان نوێنەر هەڵدەبژێرن بۆ ئەوەی لە جیاتی گروپەکەیان رای خۆی دەربڕێ.

نموونە/ لەسەر بەرپرسیاریەتی کەسی و گشتی تا چەند هاوبەشن.

- فەرمانبەر لە فەرمانگە بەرپرسیارە لە راپەڕاندنی ئیش و کاری هاوڵاتیان رۆژانە لە فەرمانگەکان چونکە ئەرکی بەرپرسیاریەتی هاوڵاتیانی لە ئەستۆیە لە هەمان کاتدا پێویستە ئەو فەرمانبەرە پارێزگاریش لە فەرمانگەکەی بکات.

- بۆ ئەوەی قوتابی بزانێ فەرمانبەری کەمتەرخەم هەیە لە فەرمانگە ئەرکی بەرپرسیاریەتی جێبەجێ ناکەن، لە هەمان کاتدا فەرمانبەری چالاک هەیە ئەرکی بەرپرسیاریەتی ئەنجام دەدات.

- کاتێک قوتابی چەمکی بەرپرسیاریەتی کەسی و گشتی لا بەرجەستە بوو هەست دەکات بەشێکە لەم کۆمەڵگەیە.

- ئینجا هەستی بەرپرسیاریەتی لا گەشە دەکات لە پاراستنی موڵکە گشتییەکان وەکو (نەخۆشخانە - ژینگەی قوتابخانە - دامودەزگا حکومییەکان - شوێنە گەشتوگوزارییەکان - .......).

ئەو کاتە لە ئاستی بەرپرسیاریەتی دا دەبن و وڵاتەکە بە وڵاتی خۆیان دەزانن و پارێزگاری لێدەکەن.

# پێشبڕکێیەك لەنێوان دوو پۆلی قوتابخانەدا



مامۆستا شیرین مامۆستای پەروەردەی مەدەنییە لە شاری دهۆک پێشبڕکێیەکی سازکرد لە نێوان هەردوو (گرووپی أ، گرووپی ب) ئەم پێشبرکێیە لە هۆڵی قوتابخانەکە ئەنجامدا کە بە وێنەی جوان و نەخشەی کوردستان کە بەرهەمی قوتابیانی قوتابخانەکە بوو رازابۆوە. مامۆستا شیرین دوای ئەوەی بە خێرهاتنی میوانەکان و قوتابییانی کرد وتی هەندێک پرسیار ئاراستەی گرووپی (أ) دەکەم و مامۆستا تاراش هەندێک پرسیار ئاراستەی گرووپی (ب) دەکات و لە کۆتاییدا ئەنجامی پێشبرکێیەکەتان بۆ ئاشکرا دەکەین.



مامۆستا شیرین/ ئێستا پرسیارەکان دەکەم بەڵام کەس لە شوێنی خۆی قسە ناکات و تەنها دەست بەرز دەکەنەوە.

پ١: ژینگە چییە؟



هێشوو/ ماموستا ژینگە هەموو ئەو شتانەیە کە دەوری ئێمەیان داوە.



ماموستا شیرین/ ئەوشتانە وەکو چی؟



هەردی/ ماموستا وەکو ئاووهەوا و خاک.



ماموستا/ ئەرکی ئێمە چییە بەرامبەر ژینگە؟



ئاسۆ/ ماموستا دەبێت بیپارێزین و پیسی نەکەین.



ماموستا/ ئەگەر ژینگە پاک بێت لە چی دوور دەکەوینەوە؟



کانی/ مامۆستا لە هەموو نەخۆشییەک دوور دەکەوینەوە تەندروستیمان باش و لەش ساغ دەبین.



مامۆستا شیرین/ ئافەرین قوتابیانی خۆشەویست دەستتان خۆشبێت و ئێستاش مامۆستا تارا پرسیارەکان ئاراستەی قوتابیانی پۆلی سییەمی (ب) دەکات



مامۆستا تارا/ قوتابیانی خۆشەویست پرسیارەکانی منیش زۆر ئاسانە هیوادارم لە وەڵام و پێشبڕکییەکەدا سەرکەوتووبن.

پ١/ قوتابیانی خۆشەویست کێ قوتابخانە و پەرتووک پێداویستیەکانی خوێندنمان بۆ دابین دەکات؟



هەنار/ مامۆستا هەندێکیان حکومەتی هەرێم و هەندێکیشیان دایک و باوکمان.



مامۆستا تارا/ ئافەرین هەنار ... ئێستا کێ پێم دەڵێت حکومەتی هەرێمی کوردستان چیتان بۆ دابین دەکات؟



رۆشنا/ مامۆستا بینای قوتابخانەو هەموو پێداویستیەکان.



سروە/ مامۆستا هەموو پەرتووکەکانمان.



مامۆستا تارا/ زۆر باشە دەستتان خۆش بێت .. ئەی دایکان و باوکان چیتان بۆ ئامادە دەکەن؟



گوڵاڵە/ مامۆستا جلوبەرگ و خەرجی رۆژانەمان.



نازە/ مامۆستا جانتا و پەڕاوەکانمان لەگەڵ پێنووس و زۆر شتی تر.



مامۆستا تارا/ ئافەرین قوتابیانی خۆشەویست.
دوا پرسیارم بەرامبەر ئەم هەموو مافانەی کە هەتانە، ئەرکی ئێوە چی یە؟



پێشرەو/ مامۆستا راگرتنی قوتابخانە و پۆلەکان بە خاوێنی.



زانا/ مامۆستا خوێندن و دوانەکەوتن.



سۆران/ مامۆستا پاراستنی پەرتووک و هەموو کەلوپەلی تر لە ون بوون و شکاندن و دڕاندن.



مامۆستا تارا/ ئەی ئافەرین قوتابیانی خۆشەویست بەمشێوەیە کوردستان پێش دەخەن و دڵی دایک و باوک و کەسوکارتان خۆش دەکەن.

**لە ئەنجامی پێشبڕکێکەدا هەر دوو پۆلەکە سەرکەوتوو بوون و پلەی یەکەمیان بەدەستهێنا بەڕێوەبەر و مامۆستایان دەستخۆشییان لێ کردن.**

# گەشتێك بۆ هاوینە هەوارەکان

لە گەشتێکی قوتابیاندا لە گەڵ مامۆستاکانیان بۆ هاوینەهەوارەکانی هەورامان لە شوێنێکی خۆش و رازاوەدا قوتابیان کۆ بوونەوە و گفتوگۆیان ئەوە بوو چۆن بتوانن ئەوانیش هاوکاربن کە نیشتمانەکەیان بکەن بە جوانترین و پاکترین وڵات .. بۆ گەیشتن بەو ئامانجە بڕیاریاندا هەریەکەیان کارێک ئەنجام بدەن.



کاوە وتی: بەڵێنیان پێدەدەم کە گەڕامەوە لادێکەی خۆمان دار گوێزێک بڕوێنم کە بەرهەمێکی خۆشی هەیە و گەڵا و سێبەری جوانی هەیە.

هەردی وتی: بڕیار دەدەم منیش دار چنارێکی جوان بڕوێنم و بیپارێزم تاکو پێدەکات و دەبێت بە بەشێک لە جوانی شارۆچکەکەم.

هێشوو کە کچۆڵەیەکی جوان و قوتابی پۆلی سێیەم بوو لەگەڵ دەستە خۆشکەکەی کە ناوی کانی بوو لەگەڵ ئاسۆ و گۆران وتیان ئێمەش پەیمان دەدەین قوتابخانەکەمان و باخچەی گەرەکەکەمان و پارکە جوانەکان و گوڵە ناسکەکانی و هەموو ئەو شوێنانەی لێی دەخوێنین و کاری تێدا دەکەین بە خاوێنی بیانپارێزین و هەموو ساڵێک لە هەڵمەتی دار چاندندا بەشداری بکەین بۆ رازاندنەوەی کوردستانی خۆشەویست. مامۆستایان کە گوێیان لەم گفتوگۆیە بوو دەستخۆشیان لە قوتابیان کرد و وتیان هەربژین ئێوەن کوردستان بەرەو گەشە و ئاوەدانکردنەوە دەبەن. هەموو شوێنێک وەک هەورامان خۆش و بە پیت و دڵرفێن بێت.

## چالاکی

١. دروستکردنی گروپێک لە قوتابیان بۆ چاندنی گوڵ لە باخچەی قوتابخانە.

٢. پاراستنی ژینگەی ماڵ ئەرکی هەموومانە، (گفتوگۆ).

٣. لە سەر نەخشەی کوردستان ناوچەی هەورامان نیشان بکە.

**ژینگەی پاک تەندروستی بۆ هەموومان دابین دەکات.**

## چارەسەرکردنی کێشەیەك

لەگەڵ یەکێک لە قوتابییەکانی تردا کاربکە، ئەم چیرۆکە دەربارەی شەونم بخوێنەوە. مامۆستاکەت دەبێت وێنەیەکت بداتێ, وەڵامی پرسیارەکانی سەر وێنەکە بدەوە. دوایی پێی بڵێ بە بۆچوونی تۆ دەبێت شەونم چی بکات و بۆ؟

# کێشەکەی شەونم

دایکی شەونم گوتی: ((دوای تەواو بوونی قوتابخانە پێویستە بچیت بۆلای پزیشکی ددان.))



دوای تەواوبوونی قوتابخانە، شیلانی هاوڕێی بە شەونمی گوت: ((گوایە بەڵێنت داوە، کە ئەمڕۆ پاش قوتابخانە بمێنیتەوە، ئێمە پێویستیمان بە تۆیە کە لەگەڵ گرووپەکەی ئێمە یاری بکەیت. ئەگەر بێت و تۆ نەمێنیتەوە, ئەوا ئێمە یاری زانی تەواومان نابێت.))

### پیشانمان بدە تۆ چی دەزانیت؟

کۆتایی بۆ ئەم چیرۆکە بنووسە. ئەم بیرۆکانە بەکاربهێنە کە لەم وانەیەدا فێربوویت. باسی ئەوە بکە کە چۆن بڕیاردرا کە ئەم چیرۆکە کۆتایی پێ بهێنرێت. شەونم بە قسەی دایکی یان هاورێیەکەی دەکات؟

# بەرپرسیاریەتی

چالاک قوتابی پۆلی سێیەمی بنەرەتیە ڕۆژێک لەگەل ئەندامانی خێزانەکەی چوون بۆ یەکێک لە سەیرانگاکانی کوردستان .. چالاک بینی لە دوورە دوو منداڵ یاری دەکەن ئاگریان دەکردەوە .. دوای کەمێک لە ئەنجامی ئاگر کردنەوەکەوە دەنگی تەقینەوەیەک ئەو ناوچەیەی هەژاند .. کە خەڵکی لییان نزیک بوونەوە تەماشایان کرد هەردوو منداڵەکە بە سەختی بریندار بوونە چالاکیش زۆر دڵتەنگ بوو بەم ڕووداوە و خۆزگەی خواست کە زووتر ئاگاداری ئەو دوو منداڵەی بکردایەتەوەو ئەوە ڕووی نەدابایە.



دوور کەوتنەوە لە سەیرانگاکان و دوورکەوتنەوە لەو شوێنانەی و ئاگر کردنەوە شتێکی هەڵەیە لەبەرئەوەی خاکی کوردستان پاشماوەی تەقەمەنی زۆری لێماوە.

# چیرۆکێك دەربارەی بەرپرسیاریەتی بەرامبەر
# بە ماڵ و قوتابخانە

دیمەن و دیار خوشک وبران، دیمەن کچێکی زیرەک بوو لای دایک و باوک و مامۆستاکانی خۆشەویست بوو، بەڵام دیار کوڕێکی زۆر لاسار بوو. ڕۆژێک مامۆستا بە قوتابییەکانی ووت بەیانی لە باخچەی قوتابخانەدا سەیرانمان هەیە بۆیە دیمەن و دیار کە هاتنەوە ماڵەوە بە دایکیان ووت بەیانی سەیرانمان هەیە لە قوتابخانە خواردنمان بۆ ئامادە بکە.

بەیانی کە گەیشتە قوتابخانە پاش نان خواردن و یاری کردن کاتێکی خۆشیان بردە سەر.



مامۆستا قوتابیانی ئاگادار کردەوە: خۆتان ئامادە بکەن بەرە و ماڵەوە بڕۆنەوە، لەو کاتەی دیمەن و دیار خەریکی کۆکردنەوەی کەڵوپەلەکانیان بوون، دیار پاشماوەی فڕێدایە نێو باخچەی قوتابخانە کاتێک دیمەن ئەم دیاریدەی بینی زۆری پێ ناخۆش بوو وتی: دیار ئەوە چی دەکەی کارێکی خراپە ئەی مامۆستا هەردەم ئامۆژگاری نەکردووین کە باخچەی قوتابخانە وەکو ماڵەوە بە پاک و خاوێنی رابگرین؟



دیار کە گوێی لەم قسانە بوو یەکسەر پەشیمان بووەوە هەستی کرد کەمتەرخەمە و لە ئاستی بەرپرسیاریەتی نیە بەرامبەر بە قوتابخانە، بۆیە داوا لێبوردنی لە دیمەنی خوشکی کرد و بەڵێنیدا کە هەرگیز کاری وا دووبارە نەکاتەوەو ژینگەی قوتابخانە پیس نەکات.

## ئێمە چۆن دەزانین کێ بەرپرسیارە؟

### تۆ لەم وانەیەدا چی فێر دەبیت.

زۆربەی کات ئێمە دەمانەوێت بزانین کێ بەرپرسیارە؟ لەم وانەیەدا چەند پرسیارێک فێردەبیت بۆ ئەوەی یارمەتیت بدات بڕیار بدەیت کێ بەرپرسیارە.

## چەند بیرۆکەیەك بۆفێربوون

### بۆچی ئێمە دەمانەوێت بڕیار بدەین کێ بەرپرسیارە؟

زۆرجار ئێمە دەمانەوێت بزانین کێ شتێکی باشی کردووە.

- ئازاد هەموو توانای خۆی خستە گەڕ، بۆئەوەی یارمەتی منداڵەکان بدات تافێری خوێندنەوە بن.



- پیاوی ئاگر کوژێنەوە ژیانی منداڵێکی لەناو بینایەکدا ڕزگارکرد، کە ئاگری گرتبوو.

ئێمە دەمانەوێت بزانین کێ کارێکی باشی کردووە، تا سوپاسی بکەین. هەروەها دەمانەوێت پێیان بڵێین کارێکی باشیان کردووە، هەندێ جار دەمانەوێت خەڵاتی ئەو کەسانە بکەین کە کاری باشیان کردووە.

هەندێ جار شت ڕوودەدات کە نابێ ڕووبدات، ئێمە دەبێت بزانین کێ بەرپرسیارە.

- یەکێک بەردی گرتە ئۆتۆمبێلەکان کە لە پارکەکەدا ڕاوەستابوون.
- ئەو پارەیە کە ئازاد لەسەر مێزەکە بەجێی هێشتبوو دیار نەماوە.



ئێمە دەمانەوێت بزانین کێ پارەکەی بردووە. دەمانەوێت ئەو کەسەی بردوویەتی بیگێڕێتەوە. دەمانەوێت بزانین کێ بەردی هاوێشتووە، دەمانەوێت ئەوکەسە زیانەکە ببژێرێت، لەوانەیە ئێمە بمانەوێت بە شێوەیەکی دادوەرانە سزای ئەوکەسانە بدەین ئەم کارانەیان کردووە.

- زۆربەی کات دەمانەوێت بزانین بۆچی ئاودەستی (توالێتی) قوتابخانە خاوێن نییە. منداڵەکان کاغەزی ئاودەستیان لەسەر زەوییەکە فڕێ داوە. کارگوزارەکان ڕۆژێ جارێک خاوێنی دەکەنەوە.

دەمانەوێت بزانین بۆچی توالێتەکە خاوێن نییە، جائەو کاتە بڕیار دەدەین چی لەبارەیەوە بکەین. لەوانەیە یاسایەک دەربارەی فڕێ دانی کاغەزی ئاودەست لەسەر زەوی دابنێین، لەوانەیە سەبەتەی زۆرتر لە ئاودەستەکە دابنێین و بمانەوێت ڕۆژێ دووجار پاکی بکەینەوە.



# ئارام و تەلەفزیون

ئارام منداڵێکی بچووکە و زۆر حەزی لە سەیرکردنی تەلەفزیۆنە بەتایبەتیش فلیمی کارتۆن بەڵام زۆر لە شاشەی تەلەفزیۆن نزیک دەکەوێتەوە بۆیە دایکی هەردەم ڕێنمایی دەکات کە تەلەفزیۆن دوور بکەوێتەوە تاوەکو چاوەکانی ئازاریان پێ نەگات، ئارامیش گوێڕایەڵی ڕێنماییەکانی دایکی نابێت.



ڕۆژێک ئارام سەیری فیلمی کارتۆنی دەکرد لە پڕێکدا دەنگێکی نامۆی بیست کە دەیگووت: ئارام بۆ ئازارم دەدەیت؟ تاکەی لە تەلەفزیۆن نزیک دەبێتەوە؟



ئارام بەسەر سوڕمانەوە گوێی لەم وتانە بوو بەدوای شوێنی دەنگەکە دەگەڕا دەنگەکەش هەر بەردەوام بوو لە قسەکردن و دەیگوت .. ئارام ئەوە لە چی دەگەڕێی؟ من لەلای تۆم من چاوەکانتم کە تۆ هەردەم ئازاریان دەدەی من زۆر بەدبەختم بەدەست تۆوە چونکە بەیانیان و ئێواران ئازارم دەدەیت...



ئینجا ئارام دەستی کرد بەگریان و فرمێسکی زۆری ڕشت و دەستی کرد بە سڕینەوەی فرمێسکەکانی و زۆر دڵتەنگ بوو بۆ چاوەکانی چونکە نەیدەزانی نزیکبوونەوە لە

تەلەفزیۆن ئاوها زیان بە چاوەکانی دەگەیەنێ و یەکسەر لە تەلەفزیۆنەکە دوور کەوتەوەو لە دوورەوە بەردەوام بوو لە سەیرکردنی فیلمی کارتۆنی .. ئارام زۆر خۆشحاڵ بوو چونکە چاوەکانی هەستیان بە ئارامی کرد و لە فرمێسک رشتن وەستان .. لەو ساتەوە ئارام بەڵێنیدا کەچیتر لە تەلەفزیۆن نزیک نەکەوێتەوە.

قصص تربوية هادفة
محمد حافظ
عمان-٢٠٠٣

## لەو چیرۆکەدا فێردابین:-

* چۆن بەرنامەیەک دابنێین بۆ سەیرکردنی تەلەفزیۆن.
* دانیشتن بەرانبەر تەلەفزیۆن بە شێوەیەکی دروست.
* لەگەڵ دایک و باوکمان سەیری بەرنامەیەکی کۆمەلایەتی دەکەین.

## چالاکی

١.ناسینی ئامێرەکانی گەیاندن لە ماڵەوە. باسکردنی لەلایەن مامۆستاوە.
٢.هۆشیاری سەیرکردنی تەلەفزیۆن ئەرکی هەمووماننە.

## گفتوگۆکردن.

زیانەکانی لە نزیکەوە سەیرکردنی تەلەفزیۆن باس بکە؟ گفتوگۆکردن لەلایەن مامۆستاوە.

# بەرپرسیاریەتی و ڕوودانی کارەسات

زانا و دانا دوو قوتابین لە شاری خانەقین، ماڵیان لە گەرەکێکی نوێیەو قوتابخانەی نییە بۆ بەردەوام بوون لە خوێندن، ڕۆژانە لە شەقامێکی سەرەکی دەپەڕنەوە بۆ ئەو قوتابخانەیەی لەوبەری شەقامەکەیە.

ڕۆژێک لە کاتی چوونیان بۆ قوتابخانە و پەرینەوە لە شەقامەکە، ئۆتۆمۆبێل لە زانای دا و گەیاندیانە نەخۆشخانە و نەشتەر گەری بۆ کرا. پاش ماوەیەک چاک بووەوە و باری تەندروستی باش بوو، دانای برای لە ئەنجامی ئەم ڕووداوە تووشی ترس و دڵتەنگی بوو. لە قوتابخانە دووا کەوت چونکە زانای برای دوواکەوتبوو لە قوتابخانە بەهۆی بەرکەوتنی و زامداربوونی.



## پرسیار/ کێ بەرپرسیارە لەم رووداوە؟:

١. دایک و باوک.

٢. قوتابخانە.

٣. شارەوانی.

٤. پەروەردە.

٥. پۆلیسی هاتوچۆ

- گفتۆگۆ کردن لە لایەن گروپی قوتابیان هۆکاری کێ بوو؟

- رووداني كارەساتەكەو بەرپرس لەوكارە كێ بوو؟ چوون؟

- هەموومان هاوكاری یەكتر بكەین بە تايبەتی ئەوانەی سەرەوە بۆ هوشیاری لە رووداوی هاتووچوو پاراستنی گیانی هاولاتی.



# فەرهەنگۆک

**بەها:** ئەو شتانەی کە لای تۆ راستن، سەرچاوەی بیروڕا و دابونەریتە، خێزانی تۆ و بەهاکانە

**سوودەکان:** ئەو شتە باشانەن کە لە ئەنجامی کارێک بە دی دێت.

**دەست بەسەرداگرتن:** کاتێک دەسەڵاتێکت هەبێت لەسەر کەسێک بەپێی یاسا

**زانیاری:** راستین یان زانیاری دەربارەی شتێک یان زانین دەربارەی شتێک.

**کێشە:** پرسیارەکە پێویستە چارەسەر بکرێت یان بیر لەچارەسەرکردنی بکرێت، هەروەها بارێکی سەختە

**کارامەیی:** ئەو توانایانەیە کە پێویستت پێ هەیە لە جێبەجێ کردنی کارێک دا

**ئامرازەکان:** ئەو شتانەن کە یارمەتی کەسێک دەدەن کە کارێک جێبەجێ بکات یان کێشەیەک چارەسەر بکات